وتاری هەژدە

زنجیره وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشِّركُ وشِركُ الطَّاعَةِ

## تەواوكەری (دیموكراسی و شورا)

## تكملة (الديمقراطية والشورى)


شێخی موجاهید

تقبله الله

أبو علي الأنباري



وەرگێڕان و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ





پێگەی ڕاستەڕێ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

دوێنێ قسەمان کرد لەبارەی پەیوەندی دیموکراسی بە شورا، وە وتمان ئەمە ئەو دەروازەیە بوو ئیخوانی میصر و کلکەکانیان توانیان موسڵمانان چەواشە بکەن لەبارەی دینەکەیانەوە کاتێك دەڵێن ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، پاشان لێیان دەپرسرێت چۆن دەیسەلمێنن کە دیموکراسی هەر ئیسلامە؟ جا ئاماژە دەکەن بە شورا، دەڵێن هەروەك چۆن لە ئیسلامدا شورا هەیە بە هەمان شێوە ئەوەی لە دیموکراسی هەیە لە شورا دەچێت لە ئیسلام، وە دوێنێ باسی ئەوەمان کرد ڕووەکانی لێکچوون کە ئەوانە پێیان وایە ڕووی لێکچوونن لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران، و هەروەها لە کاری ئەنجومەنی تەشریعی -پەرلەمان-، لەبارەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارانەوە وتمان جیاوازی هەیە لە نێوان ئیسلام و دیموکراسی لە دوو لایەنەوە، لایەنی یەکەم: کێ دەسەڵاتداران هەڵدەبژێرێت؟ وە لایەنی دووەم: کێ هەڵدەبژێردرێت بۆ حوکم؟

جا ئەوەی کە کێ دەسەڵاتداران هەڵدەبژێرێت ئەوا باسی شێوازەکەمان کرد لەمەدا، بەوەی ئەم بابەتە چڕ کراوەتەوە لە موسڵمانان، خاوەن پەیمانەکان ئەوانەی لەگەڵ موسڵمانان دەژین لە خاکی ئیسلام هیچ پەیوەندییان بەم بابەتەوە نیە و لە بنەڕەتدا بۆچوونیان وەرناگیرێت لەم بابەتەدا، بۆیە تایبەتە بە موسڵمانان ئەوان هەڵدەبژێرن، سەبارەت بەوەی کێ هەڵدەبژێردرێت بۆ دەسەڵات گرتنەدەست ئەوا تەنها موسڵمان هەڵدەبژێردرێت ئەمە لە ئیسلامدا، بەڵام لە دیموکراسیدا موسڵمان و کەسی پاڵدراو بۆ ئیسلام و جگە لەوانیش هەموویان بەشداری دەکەن لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران، هەروەها بۆیان هەیە کەسانێك هەڵبژێرن بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات کە کافری ئەسڵیین و تیایاندایە مورتەدن و تیایاندایە ڕافیضەیە و تیایاندایە و تیایاندایە، کەوایە هیچ ڕووێکی لێکچوون نیە لە نێوان شورای ئیسلام و دیموکراسی لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی حوکم دەگرێتەدەست، کاتێك گەیشتینە باسی پەرلەمان و وتمان بە هەمان شێوە

ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی چەواشەکاری و تێکەڵکردن، دەستمان کرد بە بەراوردێك لە نێوان شورا لە ئیسلام و کاری پەرلەمان لە حکومەتە دیموکراسییەکان، جا وتمان جیاوازی یەکەم لە ڕووی چەسپاندنی بەڵگەوەیە: هەندێك بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی شورا لە ئیسلامدایە (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ)[1] و (وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ)[2] ئەم فەرموودانەی الله تعالى، بەڵام لەبارەی دیموکراسییەوە ئەوا ناتوانی دیموکراسی بچەسپێنی ئەگەر بە فەرموودەیەکی هەڵبەستراویش بێت، بۆیە ئەمە چەسپاندنێکی ئیسلامییە و دیموکراسی پەیوەندی نیە لە ڕووی چەسپاندنی بەڵگەوە بە ئیسلام، پاشان بەراوردێکمان کرد لە ڕووی پێناسەوە و وتمان شورا: وەرگرتنی بۆچوونەکانی موسڵمانانە بۆ گەیشتن بە ڕاست و دروستترین بۆچوون هەر یەکێك بەگوێرەی پسپۆڕییەکەی، ئەمە پێناسەی شورایە، هەروەك (الامام ابن العربي -رحمه الله-) پێناسەی کردووە، بەڵام پێناسەی دیموکراسی: بریتییە لە سەروەری بۆ گەل و سەروەرییش واتە ئەو دەسەڵاتەی کە هیچ دەسەڵاتێکی تر لەسەرووییەوە نیە، پاشان باسی جیاوازییێکی ترمان کرد وتمان کە (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) ئەمە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی ئیماندااران، الله تعالى لە ئایەتی سوڕەتی (الشورى) باسی نۆ سیفەتی ئیماندارانی کردووە کە یەکێك لە سیفەتەکانیان بریتییە لە (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) ئەگەر بگەڕێیت لەو سیفەتانەی باسم کرد و لەنێویشیاندا (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) ئەوا ئەم سیفەتە نادۆزیتەوە لە ئەندامانی پەرلەمان، وە وتمان جیاوازییەکەش ئەوەیە کە الله تعالى فەرمووی (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) واتە مەبەستی ئیماندارانە ئیمانداران لە نێوان خۆیاندا ڕاوێژ دەکەن، ئەمە شورایە، بەڵام لە دیموکراسیدا تۆ دەزانیت ڕاوێژ بە کێ دەکات: ئەوەی لە پەرلەمانە جا یەکسانە ئێزیدی بێت یان شیوعی یان ڕافیضی یان نەسرانی یان جوولەکە ئەمە گرنگ نیە بەلایەوە، مادام گەل ئەوانەی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ببنە نوێنەریان ئەوا ڕاوێژ دەکات بە هەموو ئەوانە، بۆیە هیچ پەیوەندییێك نیە لە نێوان شورا لە ئیسلام و کاری پەرلەمان لە بابەتی ڕاوێژکردن.

(وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) واتە لە نێوان موسڵمانان، گەیشتینە بابەتێکی تر وتمان کێ ڕاوێژی پێدەکرێت لە ئیسلامدا و کێش ڕاوێژی پێناکرێت، وتمان ئەوانەی ڕاوێژیان پێدەکرێت تەنها موسڵمانانن، ڕاوێژ ناکرێت بە جگە لە موسڵمان لە بابەتی حوکم -کێ بکرێتە خەلیفە- تەنها موسڵمانان ڕاوێژیان پێدەکرێت و جگە لەوان ڕاوێژیان پێناکرێت لەم بابەتەدا، کەوایە ئەوانەی ڕاوێژیان پێناکرێت لە ئیسلامدا: جگە لە موسڵمانان ڕاوێژیان پێناکرێت، ئەمە چینی یەکەم، چونکە ڕازی نابین بە جگە لە موسڵمانان هەبن لە خاکی ئیسلام تەنها ئەگەر خاوەن پەیمان بن کە سەرانە دەدەن بە دەستی خۆیان بە زەبوونی و ملکەچ

---

(١)الشورى: ٣٨ .

(٢)آل عمران: ١٥٩ .

بوون بۆ حوکمەکانی الله عز وجل بەپێی (الشروط العُمرية)؛ ئەوانە پەیوەندیان بەم کارەوە نیە؛ بەڵام لە پەرلەمان کافران و موڕتەدان ئەوانە هەموویان ڕاوێژیان پێدەکرێت.

جیاوازی دووەم و کۆمەڵەی دووەم کە ڕاوێژیان پێناکرێت بە هەمان شێوە وتمان: عەلمانییەکان و شیوعییەکان ڕاوێژیان پێناکرێت، بۆچی؟ چونکە دان نانێین بە بوونی یەکێك لەوانە لە خاکی ئیسلام، ئەو بوونی قبوڵکراو نیە جا چۆن قبوڵ دەکرێت ڕاوێژی پێبکرێت لە کارێك لە کارەکان، بۆیە ئەو کەسەی هەبوونی قبوڵ ناکەین ئەوا بەدڵنیاییەوە هیچ پەیوەندییەکی نیە بە ڕاوێژکردن، لە کاتێکدا لە پەرلەمانی عێراقی دەبینی حیزبی شیوعی ئەندامیان هەیە، وە نەتەوەییەکان ئەندامیان هەیە، وە عەلمانییەکان ئەندامیان هەیە، وە ئەم ئەندامەی حیزبی عێراقییش ڕاوێژ دەکات بە هەموو ئەوانە و شەرم ناکات لە فەرموودەی الله تعالی لەسەر سەری (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ) ئەوانەش بە هەمان شێوە ڕاوێژیان پێناکرێت، وە باسی چینی سێیەمان کرد کە ئەوانیش ڕافیضە بوون ئەوانەش هیچ بوونێکیان نابێت هەبێت لە خاکی ئیسلام، بگەینە هەر شوێنێك بە ئیزنی الله تعالی یەك ڕافیضی ناهێڵین لەو خاکانەی پێیان دەگەین، یان دەبێت موسڵمان ببن یان دەبێت بڕۆنە ئەو شوێنانەی دەتوانن تیایدا بژین بۆیە هەتاوەکو بوونیان نەبێت لە خاکی ئیسلام کەوایە ڕاوێژیان پێناکرێت چونکە ئەو کەسەی بوونی نەبێت ئەوا ڕاوێژی بۆ نیە، بەڵام لە پەرلەمانی عێراقی دەبینی نیوەی پەرلەمان هەموویان ڕافیضەن، وە سەلیم جبوری و حیزبی عێراقی ڕاوێژ دەکەن بە هەموو ئەوانە، وە هەروەها بانگەشەی خۆدانە پاڵ ئیسلامیش دەکەن، ئەمە هەندێك جیاوازی بوو کە باسمان کرد لە نێوان شورا لە ئیسلام لەگەڵ دیموکراسی.

باسەکەمان تەواو دەکەین -وە وتمان حیزبی عێراقییش ڕاوێژیان پێناکرێت، ئەوانە هەڵگەڕاونەتەوە لە دینی الله عز وجل- جیاوازییەکی تر لە نێوان شورا لە ئیسلام لەگەڵ دیموکراسی ئەفلاتونی: لە بابەتەکانی شورا کاتێك بمانەوێت ڕاوێژ بکەین، ئەو بابەتانە چیین کە دروستە بۆ وەلی ئەمری موسڵمان ڕاوێژ بکات تیایاندا، وە ئەو بابەتانەش کامەیە کە دروستە نیە بۆی ڕاوێژ بکات تیایاندا؟

یەکەم: ئەو بابەتەی دەقێکی تێدایە کە بەڵگەدان لەسەر ماناکەی بڕاوەتەوە (قطعي الدلالة) ئەمەیان نابێت ڕاوێژ بکات بە هیچ کەسێك بەڵکو دەبێت پابەند بێت بە فەرمانی الله تعالی، هەروەك لە بابەتی ڕۆژووی ڕەمەزان دەقێکی بڕاوەیە کە ڕۆژووی فەڕز تەنها لە ڕەمەزان دەبێت، ئایا دەکرێت ڕاوێژ بکەین لە هاوین کە بیگۆڕین بۆ مانگێکی تر؟ ناکرێت؛ چونکە الله عز وجل دەقی داناوە بە دەقی بڕێنراوی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژوو دەبێت تەنها لە ڕەمەزان بێت (إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ) [1] ، پەنا بە الله، ئایا دەکرێت وەلی ئەمر ڕاوێژ بکات لەگەڵ ڕاوێژکارەکانی و براکانی لەوەی ئایا دەستی دز

(١)التوبة: ٣٧ .

ببڕین یان نا؟ ئایا زیناکەر ڕەجم بکەین یان نا؟ ئایا جەڵدە لە ئارەقخۆر بدەین یان نا؟ ئایا پشتیوانی لە نەسارا بکەین یاخود پشتببەستین بە نەسارا لەسەر غەیری خۆیان؟ ئەمانە هەموویان دەقی بڕاوەیان لەسەرە ناچێتە نێو بابەتی ڕاوێژکردن و بابەتی شورا (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ) [١] ، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکە و گاوور مەکەن بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە. دەقێکی بڕاوەیە، ناکرێت ڕاوێژ بکەین لەم بابەتە کە ئایا پشتببەستین بە نەسارا یان جوولەکە یاخود پشتنـــەبەستین!.

کەوایە دەقە بڕێنراوەکان -قطعية الدلالة- ناچێتە نێو بواری ڕاوێژکردن لە هەر بارێك لە بارەکان، ئەمەش بەشی یەکەم لە بابەتەکانی ڕاوێژکردن.

سەبارەت بەوەی ئەگەر ڕاوێژیان کرد لە بابەتێك لە بابەتەکان، پێشەوای ئیماندارا ن ڕاوێژ بکات بەوانەی لەگەڵین لە براکانی لە بابەتێکدا، وە بۆچوونەکانیش جیاواز و جۆراوجۆر بوون لە خستنەڕووی بابەتەکە، هەریەك بەشداری کرد بە بۆچوونەکەی و بۆچوونەکانیش کۆك نەبوون لەسەر بابەتێك، وە لەنێو ئەوانەدا پیاوێك دەربچێت و بەڵگەیەك بهێنێت پێویستە هەموو بۆچوونەکانیان وازلێبێنن و بگەڕێنەوە بۆ بەڵگەکە، بەڵگەی ئەمەش کە عومەر (رضي الله عنه) یاخود پێش ئەمە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) کاتێك ئەرکەکە جێگیربوو بۆ ئەو و ئەمانەتەکەی هەڵگرت، وتی: سوپای ئوسامە بەهێز و تەواو بکەن، هەروەك ئیبن حەجەر -رحمه الله- باسی دەکات لە (الفتح) -أنفذوا جيش أسامة-، هەندێك لە صەحابە بۆچوونیان وابوو سوپاکە بمێنێتەوە؛ چونکە مەدینە مەترسی هێرشی لەسەربوو لە لایەن ئەو موڕتەدانەی لە دەوری مەدینە بوون، جا بۆچوونیان وابوو سوپاکە بمێنێتەوە لە مەدینە بۆ بەرگری کردن لە شارەکە، ئینجا (الصّدیق (رضي الله عنه)) وتی: ئەمە وەسیەتی رسول الله بوو لە کاتی مردنی، بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات فەرمووی سوپای ئوسامە بەهێز و تەواو بکەن، کەوایە ئیمامی ئەبو بەکر ئێستا دەقێکی لەبەردەستە، ئەم دەقەش صەحابە دەیانەوێت کار بکەن بە غەیری ئەم دەقە، دەقەکە دەڵێت سوپاکە دەربچێت، بەڵام صەحابە پێیان وابوو مانەوەی سوپاکە لە مەدینە بۆ بەرگری کردن لە مەدینە باشترە لەوەی دەربچێت، وە (الصّدیق (رضي الله عنه)) پابەند بوو بە فەرمانی رسول الله (صلى الله عليه وسلم)"أنفذوا جيش أسامة"، بۆیە سوپای ئوسامە دەرچوو هەرچەندە صەحابە لەگەڵ ئەمەدا نەبوون، کەوایە کاتێك بۆچوونەکان جیاواز و جۆراوجۆر دەبن و یەکێکیشیان بەڵگەیەك دەهێنێت، ئەوا گەڕانەوە بۆ بەڵگەکە دەبێت.

---

(١)المائدة: ٥١ .

بەشێکی تر لەو بابەتانەی دروستە ڕاوێژیان تیادا بکەین بریتییە لە بابەتی ئەو دەقانەی بەڵگەدانی بڕاوە نیە -غير قطعية الدلالة-، هەندێك دەقمان هەیە بڕاوەیە و هەندێك دەقیشمان هەیە بڕاوە نیە لەسەر ماناکەی، واتە دەقەکە بەڵگە دەدات لەسەر زیاتر لە واتایەك، لەم دەقانە جا ئایەت بێت یان فەرموودە ئەوا دروستە بۆ وەلی ئەمر ڕاوێژ بکات بە زانایان تاوەکو مەبەستی الله عز وجل لەم دەقە بزانێت، هەروەك لەم فەرموودەیەی الله تعالی (وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ)[1] ، واتە: ژنانی تەڵاقدراو، دەبێت تا سێ جار عادەتی مانگانە چاوەڕێ بکەن و (شوو نەکەنەوە). وە وشەی "قُرُوٓءٖ" هەروەك دەزانن لە زمانی عەرەبی بەکاردێت بۆ پاکبوونەوە و بەکاردێت بۆ حەیز، جا ئەگەر ئێمە بمانەوێت پابەند بین بە فەرمانی الله عز وجل ئایا لەسەر ئافرەتی موسڵمان پێویست دەکەین کاتێك تەڵاقدرا بە سێ حەیز یاخود بە سێ پاکبوونەوە؟ بابەتەکە پێویستی بە ڕاوێژکردنە هەرچەندە ئایەتەکە لە پەڕتوکی الله ـیە -عز وجل-، کەوایە دەقەکە ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر مانای خۆی بە بەڵگەبوونێکی بڕاوە ئەوا دروستە بۆ وەلی ئەمر ڕاوێژ بکات بە زانایان تاوەکو مەبەستی الله عز وجل لەم ئایەتە بزانێت، ئینجا کە بۆیان دەرکەوت ئەوکاتە پابەند دەبن پێیەوە.

کەوایە دەقە بڕاوەکان ڕاوێژی تیادا ناکرێت، وە ئەو دەقانەی بڕاوە نین ڕاوێژکردن دروستە، دوای ئەوە ئەگەر بەسەر دەقەکان تێپەڕین و چووینە نێو بابەتەکانی بەڕێوەبردن لە لایەنی بەرپاکردنی جەنگ و بەرپاکردنی ئاشتی و بنیاتنانی شارەکان و دروستکردنی دیوانەکان و ڕێکخستنی حاڵەتەکانی بەڕێوەبردن، ئەمانە هەموویان دەچنە نێو چوارچێوەی ڕاوێژکردنەوە، دروستە بۆ پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژ بکات بە براکانی لە هەر یەکێك لەو زاراوانەی باسم کرد مادام دەقێکی بڕاوە نەبێت لە ئایەت یان فەرموودە، جا ئەگەر چووینە نێو بابەتەکانی بەڕێوەبردنەوە ئەوا ئەمانە شیاون بۆ ڕاوێژکردن لە ئیسلام، ئەمە لە دینەکەمان پێیان دەڵێین بابەتەکانی ڕاوێژکردن.

کاتێك ئەمەت زانی لە ئیسلام، ئەی چی دەڵێیت لە پەرلەمان -لە ئەنجومەنی تەشریعی- ئایا شتێك هەیە شەرم بکەن و خۆیان بپارێزن لەوەی ڕاوێژ بکەن تیایدا، جا دەقێکی بڕاوە بێت لە پەڕتوکی الله عز وجل یان لە سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)ناگەڕێنەوە لە هیچ شتێك، ئەگینا مەگەر ئایەتێك هەیە کە بەڵگەبوونی ڕوونتر بێت لە فەرموودەی الله تعالی ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨﴾[2] ، تۆ دەزانیت ئێستا ئەوان حوکم بە چی دەکەن لە بابەتی بڕینی دەستی دز، بۆیە بەم شێوەیە دەیڵێم ئەی برایان: هیچ دینێك بوونی نیە لەژێر گومەزی پەرلەمان،

(١) البقرة: ٢٢٨.
(٢) المائدة: ٣٨.

لەژێر گومەزی پەرلەمان شتێك نیە بەناوی دین، بە بەڵگەی ئەوەی ڕێگە دەدەن بە خۆیان گفتوگۆ بکەن لە هەر بابەتێك کە دەخرێتە ڕوو تەنانەت ئەگەر لە لایەن ئێزیدیێك یان ڕافیضیێك یان شیوعیێك یان عەلمانییێك یان نەسرانییێك بێت، هەموو ئەو بابەتانەی دەخرێنە ڕوو شیاون بۆ گفتوگۆ لەسەرکردن؛ چونکە ئەوانە مافیان هەیە لە ئازادی ڕادەربڕین، وە ئەوەی کە بۆچوونەکانیان بخەنە ڕوو هەروەك خۆیان دەیبینن و پێیان باشە.

سەبارەت بەوەی چۆن دەیسەلمێنیت کە دین بوونی نیە لەژێر گومەزی پەرلەمان، بەڵگەی یەکەم: چونکە ڕژێمەکە ڕژێمێکی دیموکراسییە، وە تۆش دەزانیت پێناسەی دیموکراسی: سەروەری بۆ گەل، نەك (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ)[1] ، بەڵکو سەروەری بۆ گەل، جا ئەوەی بەم شێوەیە بێت کەوایە دین هیچ پەیوەندییێکی بەوانە نیە، ئەمە بەڵگەی یەکەم.

بەڵگەی دووەم: گەل ئەوانە هەڵدەبژێرێت، ئەوانەش نوێنەرایەتی هەموو ئەو دینانەی هەن لەناو وڵاتدا دەکەن، جا ڕافیضی هەیە و نەسرانی هەیە و شیوعی هەیە و ئێزیدی هەیە، هەموو ئەوانە هەن، بۆیە ناکرێت بۆ هیچ یەکێکیان بابەتێك بخاتە ڕوو لە ڕێگەی دینەکەی، نە بەناو ئیسلامی و نە نەسرانی و نە ئێزیدی و نە شیوعی، ناتوانن شتێك بخەنە ڕوو کە پەیوەندی بە دینەوە هەبێت، بۆچی؟ چونکە شتێك هەیە لە ڕژێمی دیموکراسی بەناوی "ئازادی بیروباوەڕ" جا پێویستە لەسەریان بەر لەوەی بچنە نێو ئەنجومەنی پەرلەمان -باڵەخانەی پەرلەمان- وازبێنن لە دینەکەیان لە لای دەرگاکە، هەر یەکێکیان خۆی دادەبڕێنێت لە دینەکەی لە لای دەرگاکە پێش ئەوەی بچێتە ژوورەوە، ئینجا کاتێك چووە ژوورەوە وازدێنێت لە هەموو دینەکەی، کەسی بەناو ئیسلامی ناتوانێت هیچ شتێك بخاتە ڕوو کە پەیوەندی هەبێت بە ئیسلام، ناتوانێت، ئەگەرنا ئێزیدی بابەتانێك دەخاتە ڕوو بەگوێرەی تێڕوانینە دینییەکەی و نەسرانیش دەیخاتە ڕوو بەگوێرەی تێڕوانینە دینییەکەی، وە ڕافیضی دەیخاتە ڕوو بەگوێرەی تێڕوانینە دینییەکەی، وە ئەوانیش بەم شێوە نین ئەوان دانیان ناوە بە ئازادی بیروباوەڕ: ئەو دینەی دەیەوێت لە دەرەوەی گومەزی پەرلەمانە، بەڵام لێرەدا دەستور هەیە و قانون هەیە و ئارەزوو و هەوەس هەیە، بەڵام ئەوەی دەقێك دەهێنێت لە دینێك لە دینەکان، هەموویان ئەمە ڕەت دەکەنەوە، بۆیە هیچ دینێك بوونی نیە لەژێر گومەزی پەرلەمان، هەر بۆیەش پەرلەمانی عێراقی بەناو ئیسلامییەکانی پابەند کردووە کە هەر یەکێکیان کاتێك ئایەتێکی لە پەڕتوکی الله خوێندەوە پەنا نەگرێت بە الله لە شەیتانی ڕەجمکراو؛ چونکە بەهۆی ئەمە بێڕێزی و سوکایەتی دەکات بە برا ئێزیدییەکەی! کەوایە کوانێ شورای ئیسلام لە دیموکراسی ئەوانە، ئەمە جیاوازییێکە لە نێوان شورا لە ئیسلام و ئەم دیموکراسیە ئەفلاتونییە.

---

(١) يوسف: ٦٧.

سەبارەت بە جیاوازیێکی تر: ڕاوێژ بە کێ دەکەین؟ کاتێك بابەتەکانی ڕاوێژکردنمان زانی جا ڕاوێژ بە کێ دەکەین؟ ڕاوێژ بە کێ دەکەین لە ئیسلام و ئەوانەش ڕاوێژ بە کێ دەکەن لە پەرلەمان؟

لە ئیسلامدا ڕاوێژ تەنها بە موسڵمان دەکرێت؛ خاوەن پەیمانەکان ئەوانەی سەرانە دەدەن بە دەستی خۆیان بە ملکەچی و زەبوونیەوە ڕاوێژیان پێناکرێت لە کارێك لە کاروبارەکانی موسڵمانان، هەرچەندە ئەوان لە خاکی ئیسلام دەژین بەڵام ئەوانە ڕاوێژیان پێناکرێت.

کەوایە شورا کورت کراوەتەوە تەنها لە موسڵمانان، ئەو موسڵمانانەش دەبن بە دوو بەش: یان پێشەوای ئیمانداران -خەلیفە- ئەنجومەنێکی شورای دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ لایان کە ئەمەش دروستە لە ڕووی شەرعییەوە؛ چونکە پێغەمبەر (ﷺ)ئەوەی زیاتر ڕاوێژی پێدەکردن ڕاوێژی دەکرد بە ئەبو بەکر و ڕاوێژی دەکرد بە عومەر (رضي الله عنهما)، ئەمە ڕاوێژێکی جێگیرە، بەڵام دروستە بۆ وەلی ئەمر ئەم ئەنجومەنە ببڕێت و ڕاوێژ بکات بە هەر خاوەن پلە و جێگەیەك لە جێگەکانیان، لە فڵانە جێگە ڕاوێژ دەکات بە فڵانە کۆمەڵ، بەڵام لە هەندێك بابەتدا دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوانەی زۆربەی جار ڕاوێژیان پێدەکات، ئەم حاڵەتە کامەیە؟

وتمان پێغەمبەر (ﷺ)زیاتر ڕاوێژی بە ئەبو بەکر و عومەر (رضي الله عنهما)دەکرد، بەڵام دوور لەم پسپۆڕییە ئەوا پێغەمبەر (ﷺ)ڕاوێژی دەکرد بە هەر دەستەیەك لەو جێگەیەی ئەو تیایدا بوو، هەروەك لە غەزوەی بەدر، کاتێك دەرچوو بەرەو بەدر و نیەتەکەش وابوو دەست بگیرێت بەسەر کاروانەکە پاشان کاروانەکە دەربازی بوو، ئینجا سوپایەك دەرچوو لە مەککەوە بەرەو بەدر، جا پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی لەبارەی سوپای بەدر: ڕاوێژم لەگەڵ بکەن ئەی خەڵکینە، جا (الصدیق (رضي الله عنه)) قسەی کرد، دیسان فەرمووی ڕاوێژم لەگەڵ بکەن ئەی خەڵکینە، جا عومەر (رضي الله عنه)قسەی کرد، دیسان فەرمووی ڕاوێژم لەگەڵ بکەن ئەی خەڵکینە، جا میقداد بن عمرو (رضي الله عنه)قسەی کرد، هەر فەرمووی ڕاوێژم لەگەڵ بکەن ئەی خەڵکینە، ئینجا (سعد بن معاذ (رضي الله عنه)) هەڵسایەوە و وتی: وەك بڵێی مەبەستت ئێمە بێت ئەی رسول الله، ئینجا وتی "إن ذهبت بنا تجدنا صبرا في القتال وإذا خضت بنا..." ئەم قسەیەی کرد، کەوایە پێغەمبەر (ﷺ)دەیەویست ڕاوێژ بکات بە کۆمەڵەیەك لەناو کۆمەڵێکدا؛ چونکە ئێستا ئەوان پەیوەندیدار بوون بە ڕاوێژکردن لە نێو سوپای بەدر، هەر بۆیە وازی نەهێنا بە وتنی "أشيروا عليّ" تەنها ئەو کاتەی بۆچوونی پشتیوانانی وەرگرت چونکە ئەوان پەیوەندیدار بوون بە بابەتی ڕاوێژکردن لەم جێگەیەدا.

نموونەیەکی تر: لە غەزوەی ئوحود کاتێك پێغەمبەر (ﷺ)زانی سوپای مەککە -موشریکەکان- دەرچوون بە ئاڕاستەی مەدینە و دەیانەوێت شارەکە داگیر بکەن، بۆیە دەستی کرد بە ڕاوێژکردن بە هاوەڵانی لەناو مەدینە: ئایا بجەنگین لە ناوەوە -لەناو مەدینە- یان ڕووبەڕوویان ببینەوە لە دەرەوەی مەدینە؟ ئەمەش بە

هەمان شێوە ڕاوێژکردنە بە خاوەن پلە و جێگەکە لەم شوێنەدا.

هەروەها لە جێگەی سێیەم -نموونەیەکی تر- کاتێك ئەحزاب هاتن، دە هەزار موشریك پەنا بە الله، وە وەستان لەسەر خەندەقەکە بە مەبەستی چوونە نێو مەدینە، پێغەمبەریش ﷺدەیەویست ئەم کۆمەڵ و گردبوونەوەیە پارچە پارچە بکات، وە ڕێگەچارەکەی ئەوە بوو کە ئەو ئەگەر سێیەکی بەروبوومی مەدینە بدات بە "غطفان" بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە و دوورکەونەوە لە مەدینە، ویستی ئەم کارە بکات، بەڵام پێش ئەوەی ئەنجامی بدات ڕاوێژی کرد بە خاوەن بەروبوومەکان جا (سعد بن معاذ) و (سعد بن عبادة) ﵄هاتن ئینجا ئەویش ڕاوێژی پێکردن: چی دەڵێن سێیەکی بەروبوومی مەدینە بدەین بە "غطفان" لەسەر ئەوەی بگەڕێنەوە، وتیان: ئەی رسول الله ئەمە فەرمانە یان تۆ خێر و چاکەت بۆ ئێمە دەوێت؟ فەرمووی: بەڵکو چاکەم بۆتان دەوێت، وتیان: والله ئەی رسول الله ئەوان نەیانتوانیوە لە بەروبوومەکانمان بخۆن تەنها بە میوانداری یان بە فرۆشتن نەبێت، ئایا دوای ئەوەی الله شکۆمەندی کردین بە ئیسلام پێیان ببەخشین! والله لە نێوان ئێمە و ئەواندا تەنها شمشێر هەیە، ئەمە ڕاوێژکردنە، لەم جێگەیەدا ڕاوێژکرا بەوانە.

هەروەها عومەر ﵁کاتێك دەسوڕایەوە لەناو مەدینە لە شەودا، گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو کە شیعری دەخوێندەوە بە دەنگی بەرز وەك ئەوەی سکاڵا بکات لە تەنیاییەکەی و دووری مێردەکەی لەو: "والله لولا الله وحده لتحرك من هذا السرير ركنان" وتەیەك بوو ئافرەتەکە وتی، وە عومەر ﵁گوێی لە قسەکە بوو، پاشان لە ئافرەتەکەی پرسی: کێشەت چییە؟ وتی: ئەی پێشەوای ئیمانداران هاوسەرەکەم لە غەزوەیەکە و دووربیەکەی درێژەی کێشا، ئینجا هاتە لای دایکمان (حفصة -رضي الله عنها-)، وتی: ئافرەت چەند ئارام دەگرێت لە دووری هاوسەرەکەی؟ -ڕاوێژکردنە- ئەویش وتی: سبحان الله، ئایا کەسێکی وەك تۆ لە من دەپرسێت دەربارەی ئەم بابەتە؟! وتی: ئەمە بابەتێکە دەمەوێت سەیری بکەم بۆ موسڵمانان هەر بۆیە لێم پرسی، ئینجا وتی: چوار مانگ پێنج مانگ شەش مانگ، بۆیە فاروق ﵁ بڕیاری دا کە پیاو چوونی مانگێك بێت و گەڕانەوەشی مانگێك بێت و چوار مانگیش لە سەنگەرەکان بمێنێتەوە و مۆڵەتەکان لەسەر ئەم بنەمایە ڕێکخران.

کەوایە ئەم فەرمانە کە لە لایەن پێشەوای ئیمانداران دەرچوو لەسەر بنچینەی ڕاوێژکردنی بوو بە ئافرەتێکی موسڵمان، جا لە هەر جێگەیەکدا پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژ دەکات بەوانەی وایان دەبینێت شایستەی ڕاوێژپێکردنن بەگوێرەی تایبەتمەندییەکانیان، وە پێشەوا و دەسەڵاتداران لە ئیسلامدا نابەستنەوە بە کارەکان لە ڕاوێژکردندا، واتە لە پێویستی نیە کە ئەوانەی ڕاوێژیان پێدەکرێت لە لای پێشەوای ئیمانداران لەوانە بن کە تەمەنیان لەسەرووی چل ساڵ یان پەنجا ساڵی و هاوشێوەی ئەم

شتانە بێت، نەخێر، هەر یەکێك -ئەگەر لە بابەتەکانی ئەحکام بێت- هەروەك ئیمامی قوڕتوبی -رحمه الله- دەڵێت: "زانایان و دیندارەکان پێش دەخرێن و ئەگەریش لە کاروبارەکانی دونیا بێت ئەوا زانایان و دانایان و خاوەن ئەزموونەکان پێش دەخرێن"، بۆیە لە چوارچێوەی ئەمە ڕاوێژکردنی عومەر بوو ﴿رضي الله عنه﴾ بە (عبد الله بن عباس) هەرچەندە ئەو بیست ساڵی لە تەمەنیدا تەواو نەکردبوو لەو کاتەدا؛ بەڵام خاوەنی زانست بوو.

کەوایە ئەوانەن ڕاوێژیان پێدەکرێت لە ئیسلامدا، وە لە موسڵمانان تێناپەڕێت و بۆم باس کردی سەلیم جبوری ڕاوێژ بە کێ دەکات لەناو پەرلەمان، ئەمەش جیاوازییێکە لە نێوان شورا و پەرلەمان.

جیاوازییێکی تر ئەوەیە: ئەمە ناتوانێت تێبپەڕێت لە ئەندامانی پەرلەمان لە ڕاوێژکردندا، تەنها ڕاوێژ دەکات بەم برە زۆرە لە کافران و موڕتەدان، بەڵام لە دەرەوەی ئەوانە ناتوانێت بۆچوونی هیچ کەسێك وەربگرێت و بڕیارێك بدات بەگوێرەی ئەمە کە لە دەرەوەی پەرلەمانە، ئەمەش جیاوازییێکە لە نێوان شورا و دیموکراسی، لە شورا پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژ دەکات بەوەی پێی باشە، دەشێت ڕاوێژ بکات بە کۆمەڵێك، دەشێت ڕاوێژ بکات بە هەندێك تاك دەشێت ڕاوێژ بکات بە هەندێك ئافرەت، بەڵام ئەوانە تێناپەڕن لە ئەنجومەنی تەشریعی لە هەر بارێك لە بارەکان، وە هیچ کەسێك گومان نەبات کە کاتێك بەڵگەم هێنایەوە بە وتەی عومەر ﴿رضي الله عنه﴾بۆ دایکمان (حفصة) مانای ئەوە بێت دروستە بۆ ئافرەتی ڕافیضی و ئێزیدییش بچێتە پەرلەمان و ببێتە ئەهلی شورا ! نەخێر، بەڵکو ئەم بابەتە پەیوەستە بە ئافرەتان هەر بۆیە عومەر ﴿رضي الله عنه﴾ڕاوێژی کرد بە دایکمان (حفصة) لەم بابەتەدا، وە تۆ دەزانیت ئێستا ئافرەتی ئێزیدی شتانێك باس دەکات کە پەیوەستە بە تەواوی گەلی عێراق! وە ئافرەتی ڕافیضی باسی دەکات و ئافرەتی نەسڕانی باسی دەکات و سەرکۆت باسی دەکات، بۆیە هیچ پەیوەندیێك نیە لە نێوان قسەکەم دەربارەی (حفصة -رضي الله عنها-) و ڕووی لێکچوونیش نیە لەگەڵ ئەو ئافرەتانە لە پەرلەمان، کەوایە ئەمە لە قیاسدا جیاوازییێکە لە نێوان شورا و دیموکراسی.

بابەتێکی تر لە جیاوازی لە نێوان شورا و دیموکراسی، ئەگەر پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژی کرد بە براکانی، سەرچاوەی گەڕانەوە بۆ لای کێ دەبێت، کاتێك بۆچوونەکان جۆراوجۆر بوون کێ جیاوازییەکە هەڵدەگرێت لەم دانیشتنە؟ پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژ دەکات بە براکانی و ڕێکنەکەوتن لەسەر شتێك، چارەسەرەکە چۆنە لە شورا لە ئیسلامدا پاشان دەگەڕێینەوە لای دیموکراسی و ناونیشانەکەش ئەوەیە کێ جیاوازی و ناکۆکییەکە هەڵدەگرێت؟

یەکەم: ئەوەی جیاوازی هەڵدەگرێت و ناهێڵێت پەڕتوکی الله عز وجل و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﴿صلى الله عليه وسلم﴾، کاتێك گفتوگۆیان کرد لە بابەتێك لە بابەتەکان پاشان بەڵگەیەکیان لە بەڵگەکان بۆ ڕوون بووەوە،

وازدێنن لە هەموو بۆچوونێك و دەگەڕێنەوە بۆ لای پەڕتوكی الله عز وجل و سوننەتی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) لەبەر ئەم فەرموودەیەی الله تعالى ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾[1] ،واتە: خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە الله و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان. ئێستا لێکۆڵینەوە دەکەین لە بابەتێك و بۆچوونەکانیش ڕێك نەکەوتن بەڵام ئایەتێکمان دۆزییەوە، کەوایە بابەتەکە یەکلابووەوە لە لامان کاتێك دەگەڕێینەوە لای ئایەتی پەروەردگارمان و دەگەڕێینەوە لای فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ).

بەڵگەیەکی تر لەسەر گەڕانەوە -لەسەر ئەوەی ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای بەڵگە کاتێك بۆمان دەرکەوت- ئەوەی هاتووە لە کاری عومەر (رضي الله عنه)هەروەك بوخاری -رحمه الله- ڕیوایەتی کردووە لە (عبد الله بن عباس) -ڕەزای الله تعالى خۆی و باوکی بێت-، کاتێك ڕووی کردە شام بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو شار و ناوچانە، سەرکردەکانی سەربازەکان پێی گەیشتن وەك (أبي عبيدة وخالد وزيد بن سفيان) -ڕەزای الله تعالى لە هەموویان بێت- لە ناوچەیەك لە دەرەوەی ئەو خاکانە، وە پێیان ڕاگەیاند کە تاعون بڵاوبووەتەوە لەو ناوچانە، ئینجا بابەتەکە ماوەیەوە دوای ئەوەی زانرا تاعون هەیە لەو ناوچانە ئایا بچنە ناویەوە یان نا؟ بابەتێکە پێویستی بە شورایە، جا وتی: بانگی کۆچەرە یەکەمەکانم بۆ بکەن، ئینجا هێنایانن بەڵام ڕێکنەکەوتن لەسەر بۆچوونێك و ناکۆك بوون، هەیان بوو دەیوت بڕۆ ناویەوە و کێشەی نیە، وە هەیان بوو دەیوت بگەڕێوە لەگەڵ هاوەڵانی رسول الله (ﷺ)و مەیانخە نێو ئەم دەروازەیە، وتی: جێم بهێڵن، پاشان وتی: بانگی پشتیوانانم بۆ بکەن، جا ئەوانیش ڕێچکەی کۆچەرانیان گرتەبەر -ڕێکنەکەوتن لەسەر بۆچوونێك- وتی: جێم بێڵن، پاشان وتی: بانگی ئەوانەم بۆ بکەن کە لە پیرەکانی قوڕەیشن لەوانەی لە کاتی فەتحەوە موسڵمان بوونە -ئەوانەی لێرەن لە پیرەکانی قوڕەیش لە موسڵمانبووەکانی فەتح: ئەو کەسە بەساڵاچووانە بوون کە لە مەککە لە سەردەمی فەتح بوونە و موسڵمان ببوون، ئەوانەم بۆ بهێنن- ئەوانەش هاتن و فاروق (رضي الله عنه)لێیانی پرسی: بۆچوونتان چۆنە بچینە ناویەوە یان بگەڕێینەوە؟ جا هیچ یەکێکیان جیاواز نەبوون، وتیان: وای دەبینین بگەڕێیتەوە باشترە ئەی پێشەوای ئیمانداران و نەچینە ناویەوە لەم کاتەدا، ئینجا فاروق وتی: إني مُصبح على ظَهر فأصبحوا، واتە سبەی بەیانی سوار دەبم و دەگەڕێمەوە ئێوەش بە هەمان شێوە سوار ببن و بگەڕێنەوە.

کەوایە لێرەدا کێ جیاوازییەکەی هەڵگرت؟ فاروق (رضي الله عنه) بە هەڵبژاردن، دوای ئەوە (عبد الرحمن بن عوف (رضي الله عنه)) کە لەو کاتە لەوێ ئامادە نەبوو، واتە لەوانەیە دەرچوو بێت بۆ پێویستیەکی و جا بە

---

(١) النساء: ٥٩.

ڕاوێژکردنەکەی فاروق بە هاوەڵەکانی زانی و ئینجا وتی: من زانیارییەکم لەسەر ئەمە هەیە -ئەمەی ڕاوێژتان کردووە تیایدا زانیارییەکم هەیە لەسەری- گوێم لە رسول الله (ﷺ)بوو دەیفەرموو: "إذا سمعتم به في أرض فلا تقدموا عليها فإذا وقع بأرض وأنتم بها فلا تخرجوا منها فرارا"، واتە: ئەگەر گوێبیست بوون لەوەی (ئەم نەخۆشیە) هەیە لە خاکێکدا ئەوا مەچوونە ئەوێ بەڵام ئەگەر لە خاکێك سەریهەڵدا و ئێوەش لەوێ بوون ئەوا لێی دەرمەچوون و جێی مەهێڵن.

ئێستا ڕاوێژکردنێکمان هەیە و دەقێکمان هەیە، دەڵێم: ئەگەر عومەر (رضي الله عنه) دوای ڕاوێژکردن، ئەگەر بۆچوونەکەی جێگیر بوایە لەسەر ئەوەی بچێتە نێو ئەو ناوچانە پاشان دەقەکەیان بۆ هێنابایە، بەدڵنیاییەوە پەشیمان دەبوویەوە لە بۆچوونەکەی و دەگەڕایەوە بۆ دەقەکە و دەگەڕایەوە لەم ناوچانە و نەدەچووە ناویانەوە، بۆچی؟ چونکە ڕاوێژیان کرد بەر لەوەی دەقەکە پێیان بگات بۆچوونەکەی جێگیر بوو لەسەر ئەوەی بگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر بۆچوونەکەی جێگیر بوایە لەسەر ئەوەی بچێتە ناویانەوە پاشان دەقەکەی پێگەیشتبا بەدڵنیاییەوە وازی لە بۆچوونەکەی دەهێنا و دەگەڕایەوە و پابەندی فەرموودەی رسول الله (ﷺ)دەبوو، بۆیە کاتێك (عبد الرحمن بن عوف (رضي الله عنه)هەواڵی پێدا بە فەرموودەکە، سوپاس و ستایشی الله ـی کرد لەسەر ئەوەی کە ئەوەی ئەو هەڵیبژاردبوو موافقی فەرموودەی رسول الله (ﷺ)بوو.

کەوایە بابەتی یەکەم لە نەهێشتنی ناکۆکی و جیاوازی لە شورا ئەوەیە کە ئێمە بگەڕێینەوە لای پەڕتوکی الله عز وجل، جا ئەگەر بەڵگەیەکمان دۆزییەوە ئیتر هەمووان پێویستە وازبێنن لە بۆچوونەکانیان و پابەند ببن بە فەرموودەی الله تعالى و پابەند ببن بە فەرموودەی رسول الله (ﷺ).

سەبارەت بەوەش ئەگەر پێشەوای ئیمانداران بۆچوونێکی پێچەوانەی دەقی هەڵبژارد -حاشا لەو- بۆچوونێکی پێچەوانەی دەقێك لە پەڕتوکی الله عزّ وجل یان سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)هەڵبژارد ئەوا هیچ یەکێك لە موسڵمانان بۆی نیە گوێڕایەڵی بکات، لەبەر فەرموودەی رسول الله (ﷺ): "لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق"[1]، واتە: گوێڕایەڵی کردن نیە بۆ هیچ کەسێك لەوەی سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری تێدایە. مادام ئێستا بۆچوونەکە پێچەوانەی دەقێك لە دەقەکانی شەریعەتی پیرۆزمانە، ئەوا گوێڕایەڵی الله دەکەین و گوێڕایەڵی بەندە ناکەین ئەگەر فەرمانمان پێبکات بەوەی پێچەوانەی فەرمانی الله ـیە -عز وجل، کەوایە یان دەگەڕێینەوە بۆ لای پەڕتوکی الله، وە ئەگەر فەرمانێکیشمان بۆ هات پێچەوانەی فەرمانی الله عز وجل بوو ئەوا هیچ گوێگرتن و گوێڕیەڵیێکی بۆ نیە.

---
(١) رواه أحمد وعند البخاري ومسلم بمعناه.

سێیەم شت ئەوەیە کە دەشێت پێشەوا ناکۆکییەکە هەڵبگرێت و نەهێلێت، ئەم بابەتەی قورئان زانیمان بابەتی ئەوەی فەرمان دەکات بە جگە لەوەی الله دایبەزاندووە زانیمان، وە بیرت نەچێت کە پێشەوا کاتێك ڕاوێژ دەکات لە هەندێك بابەت، لەوانەیە زۆرینە هەبێت و لەوانەیە کەمینە هەبێت بەدڵنیاییەوە، وە دەکرێت پێشەوای ئیماندارانیش بۆچوونێکی هەبێت، جا کاتێك ڕاوێژ دەکات بە کۆمەڵەیەك لەبارەی بابەتێك، زۆرینە دەڵێن: بەڵێ، وە کەمینە دەڵێن: نەخێر، ئەویش بۆچوونێکی هەیە جا کەوایە چارەسەر چییە لە نموونەی ئەم بابەتانە، ئێستا هیچ دەقێك نیە بەڵکو لە بابەتەکانی بەڕێوەبردنە؟

لە دینی ئێمەدا مەرج نیە حەق لەگەڵ زۆرینە بێت، پێشەوای ئیمانداران پابەند نابێت بە بۆچوونی زۆرینە هەرچەندە زۆرینەشن؛ چونکە پێوەرەکان لێرەدا کار ناکەن بە زۆرینە لەبەرئەوەی الله عز وجل پێمان دەفەرموێت (وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ) [1] ، واتە: بەڵام زۆربەیان ڕقیان لە ڕاستی ـیە و حەز لە حەق ناکەن و پێی سەغڵەتن. ئەوانە زۆرینەن ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ۝١٠٣﴾[2] ، واتە: (دڵنیاش بە) کە زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن، هەرچەندە تۆ زۆر بەپەرۆش بیت و هەوڵ بدەیت. ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾[3] ، واتە: خۆ ئەگەر فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بیت ئەوا لە ڕێبازی الله وێڵت دەکەن و لات دەدەن. بۆیە ئەمە پێوەر نیە لە لامان کە ئەم بۆچوونە پەسەند بکەین چونکە زۆربەی دانیشتووەکان وتویانە، نەخێر، ئەمە پێوەر نیە لە دینی ئێمە بەڵکو لەوانەیە پێشەوای ئیمانداران بۆچوونی زۆرینە پەسەند بکات و لەوانەیە بۆچوونی کەمینە پەسەند بکات و لەوانەشە بۆچوونی هیچ کامێکیان پەسەند نەکات بەڵکو ئەو بۆچوونە پەسەند بکات کە خۆی هەیەتی، وە هەر یەکێکیان بکات ئەوا پێکاویەتی بە ئیزنی الله تعالی.

سەبارەت بە بەڵگەش لەسەر بابەتی زۆرینە و کەمینە و کامەیان هەڵدەبژێردرێت، ئەوەی لە غەزوەی ئوحود ڕوویداوە کاتێك پێغەمبەر ﷺڕاوێژی کرد ئایا دەربچین یان دەرنەچین، بەشێکیان وتیان: دەربچین، وە بەشێکیان وتیان: دەرنەچین، دەرچوونی هەڵبژارد و ئیتر هەموویان دەرچوون لەگەڵی، بەڵام هەندێك جار زۆرینە هەیە و پەسەندیان کردووە و کەمینەش قسەیەکی تریان کردووە، بەڵام پێشەوای ئیمانداران بۆچوونێکی تری هەبووە، ئایا دەتوانێت بۆچوونەکەی خۆی جێبەجێ بکات دوای ئەوەی گوێبیستی بۆچوونەکانی ئەوانە بوو؟ بەڵێ دروستە بۆی؛ چونکە ئەویش بە هەمان شێوە چاکەی دەوێت بۆ ئوممەت و سەرکەوتنی ئەم دینەی دەوێت، بەڵام بۆی ڕوون بووەوە کە ئەگەر کارەکە ئەنجام

(١) المؤمنون: ٧٠.
(٢) يوسف: ١٠٣.
(٣) الأنعام: ١١٦.

بدات بەگوێرەی ئەوەی دەیبینێت ئەوا خێر و چاکەی تێدا دەبێ بە ئیزنی الله تعالی، بەڵگەی ئەمە چییە؟ لە جەنگەکانی ڕیدە دوای کۆچی دوایی رسول الله ﴿ﷺ﴾ ئیمامی ئەبو بەکر بڕیاری جەنگکردنی دا لە دژیان، صەحابە دژی بڕیارەکە بوون، چۆن دەجەنگیت لەگەڵ کەسانێك کە شایەدی دەدەن بە لا إله إلا الله وأن محمد رسول الله، ئینجا (الصدیق) بە بڕێنراوەییەوە وتی: "والله ئەگەر ڕەتی بکەنەوە ئەو پەتەم پێبدەن کە دەیاندا بە رسول الله ﴿ﷺ﴾ئەوا دەجەنگم لەسەر ئەو ڕەتکردنەوەیەیان"[١] ، ئەمە بۆچوونی ئەو بوو هەرچەندە بۆچوونی صەحابە جیاواز بوو لە بۆچوونی ئەو لە بابەتی جەنگکردن، دوای ئەوە عومەر ﴿رضي الله عنه﴾وتی: "والله ئەمە شتێکی تر نیە جگە لەوەی وای دەبینم الله سینەی ئەبی بەکری گوشاد و فراوان کردووە بۆ جەنگکردن بۆیە زانیم ئەو لەسەر حەقە"[٢] ، کەوایە دەشێت بۆچوونی زۆرینە پەسەند بکرێت و دەشێت بۆچوونی کەمینە پەسەند بکرێت و دەشێت ئەویش بۆچوونێکی هەبێت و وای ببینێت کە خێر و چاکی لەم کارە دایە بۆیە ئەنجامی دەدات.

ئەمە لە دینەکەمان، بابەتێکی پەیوەست هەیە بەوەی باسم کرد: ئەگەر پێشەوا بۆچوونی زۆرینەی پەسەند کرد یان بۆچوونی کەمینەی پەسەند کرد یان بۆچوونی خۆی پەسەند کرد، ئایا دروستە -ئەگەر هاتوو دوای ئەمە دەرەنجامەکان نەرێنی بوون- ئایا دروستە بۆ یەکێك لە موسڵمانان لۆمەی بکات یاخود سەرزەنشتی بکات؟

بۆی نیە ئەمە بکات، ئیماندااران ئەم کارە ناکەن، واتە زۆرینە نایەن و بڵێن: بۆچوونی کەمینەی پەسەند کرد و بۆچوونی ئێمەی پەسەند نەکرد سەیربکە چیمان بەسەر هات، وە ناکرێت ئەم کۆمەڵەیە بێن و بڵێن: ئێمە وتمان و ئەوانەش وتیان جا بۆچوونی ئێمەی پەسەند نەکرد و بۆچوونی ئەوانەشی پەسەند نەکرد، بەڵکو بۆچوونی خۆی پەسەند کرد سەیربکە چیمان بەسەر هاتووە! ئیماندااران ئەم قسەیە ناکەن لە شورای ئیسلام، بەڵگەی ئەمە لە پەڕتوکی پەروەردگارمان ﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾[٣]، واتە: خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆ دەکردەوە بۆ خۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو. بۆیە کاتێك ئەم بڕیارەی پەسەند کرد هەموویان نەیاندەزانی ئەم بڕیارە چی لێدەکەوێتەوە لە لایەنی ئەرێنی یان نەرێنییەوە، ئەگەر بیزانیایە ئەم بڕیارە ئەنجامەکانی نەرێنی دەبێت بەدڵنیاییەوە جێبەجێی نەدەکرد، کەوایە ئەو ئەنجامی دەدات و هاوکات چاکەشی دەوێت جا چەند کەس هەیە چاکەی دەوێت لەوانەشە هەڵە بکات و بە پێچەوانەوە ڕوودات ﴿وَلِلَّهِ غَيۡبُ

(١) رواه البخاري.

(٢) رواه البخاري.

(٣) الأعراف: ١٨٨.

﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾[1] ، الله عز وجل خاوەنی غەیب و شاراوەکانە، ئێمە ئادەمیزادین بڕیار دەدەین بەڵام نازانین دوای ئەوە چی ڕوودەدات.

لە نموونەی ئەمە: "بڕیارەکە لە کاتی خۆیدا ڕاست و دروستە جا دەرەنجامەکان هەر چۆنێك بێت"، ئیماندارانی ڕاوێژکار دەڵێن: بڕیار لە کاتی خۆیدا ڕاست و تەواوە، بەڵام لێپرسینەوە ناکەن لەسەر بڕیارەکە بەپێی دەرەنجامەکان، بەڵگەی ئەمە، کاتێك پێغەمبەر ﷺ (الوليد بن عقبة بن أبي معيط)ـی هەڵبژارد و پێی سپارد کە بڕوات و زەکاتی قەومێك لە قەومەکان بهێنێت، گەیشتە ئەوێ و پێش ئەوەی بچێتە نێو گوندەکە گەڕایەوە چونکە دوژمنداریێك هەبوو لە نێوانیاندا لە سەردەمی جاهیلی بۆیە ترسا لەوەی بیکوژن، گەڕایەوە لای رسول الله ﷺو وتی: خەڵکەکە ڕەتیان کردەوە زەکات و بەخشینەکان بدەن، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئامادەکاری کرد بۆ هێرشکردنە سەریان جا الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ﴾[2] ، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێنەکراو و فاسق هەواڵێکی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، نەوەکو ئازار و ناخۆشی و گیروگرفت بۆ خەڵکێك دروست بکەن بە نەزانی. ئایا ساتی هەڵبژاردنی (الوليد بن عقبة) ئەو کات فاسق بوو؟ پەنا بە الله؛ چونکە ئەگەر فاسق بوایە ئەوا پێغەمبەر ﷺهەڵینەدەبژارد، کەوایە وای بینی کە ئەو شایستەیە بۆ ئەم کارە بۆیە هەڵیبژارد، بەڵام دوای هەڵبژاردنەکە ڕوون بووەوە کە ئەو فاسقە و الله عز وجل ئایەتێکی دابەزاند لەبارەیەوە.

کەوایە لە ڕاوێژکردندا ئیمانداران لێپێچینەوە ناکەن لەگەڵ وەلی ئەمر لەسەر دەرەنجامەکان هەرچەندە نەرێنییش بن، باشە، ئەی کێ لێپرسینەوە دەکات؟ تەنها مونافیقەکان لە دینی ئێمە لێپرسینەوە دەکەن لەگەڵ خاوەنی بڕیارەکە لەسەر ئەنجامەکە ئەگەر نەرێنی بێت، تەنها مونافیقەکانن دژی دەوەستنەوە و لۆمە و سەرزەنشتی خاوەن بڕیار دەکەن ئەگەر دەرەنجامەکان نەرێنی بن، سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە کە دەربارەی مونافیقەکانە ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٦٨﴾[3]، واتە: ئەوانەی بۆی دانیشتن و (نەچوونە جەنگ) بە براکانی خۆیانیان وت: ئەگەر ئەوانە (واتە شەهیدەکان) بە قسەی ئێمەیان بکردایە نە دەکوژران، ئەی پێغەمبەر ﷺپێیان بڵێ: دەی کەواتە مردن لە خۆتان دووربخەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن. -ئێمە وتمان دەرناچین- سەرنج بدە،

---

(١) هود: ١٢٣.

(٢) الحجرات: ٦.

(٣) آل عمران: ١٦٨.

ئەگەر گوێیان لە قسەکەمان بگرتایە ئەوەیان تووش نەدەبوو کە تووشیان هات، کەوایە ئەو مونافیقانە هەمیشە لێپرسینەوە دەکەن لەسەر دەرەنجامەکان، بەڵام ئیماندارانی بڕیارەکە دەدەن لە کاتی خۆیدا و دەزانن ئەم بڕیارە تەواو و دروستە پاشان نازانن ئەم بڕیارە چی لێدەکەوێتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك بڕیاری دەرچوونی دا بۆ ئوحود، حەفتا لە صەحابە کوژران، مەگەر لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت -حاشا لەو- مەگەر سەرزەنشت دەکرێت؟ نەخێر؛ چونکە نەیدەزانی چی ڕوودەدات (**وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ**) ئەمە لە شورا.

لەگەڵم وەرە بۆ لای دیموکراسی، سەرەتا هیچ شتێك نیە بەناوی گەڕانەوە بۆ پەڕتوکی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، شتێکی لەم جۆرە نیە، نە قورئان و نە سوننەت سەرچاوەن لە ڕاوێژکردنی ئەنجومەنی تەشریعی و پەرلەمان، هیچ کەسێك بۆی نیە بەڵگە بێنێتەوە بە ئایەتێك یان بە فەرموودەیەك، ئەگینا ئێزیدییش بە هەمان شێوە دەقێك دەهێنێت لە پەڕتوکی ڕەش و خەڵکیش پابەند دەکەن بەم دەقە کە لە پەڕتوکی ڕەش هێناویەتی، پێی دەڵێن پەڕتوکی "ڕەش"[(١)] کە هیچ بوونی نیە، کاتێك پرسیاری لێدەکەی پەڕتوکەکەت لە کوێیە؟ دەڵێت: لە ئەڵمانیا، بەڵام هەندێك دەقیان هەیە لەم پەڕتوکە، بۆیە ئەگەر ئەوان بەڵگە بێننەوە، ئەوانەش بەڵگە دێننەوە، وە لەوانەیە نەسرانییێکیش هەندێك دەق لە ئینجیلە دەستکاریکراوەکەی بهێنێت و هەوڵ بدات ئەوانە پابەند بکات، بۆیە هیچ کەسێك ناتوانێت بگەڕێتەوە لای پەڕتوکەکەی لەبەرئەوەی پەڕتوکەکان جیاواز و جۆراوجۆرن و هەر دینێك پەڕتوکێکی هەیە، جا ئەوانە ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ پەڕتوکی الله عز وجل، وە نە ئەوانەش دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئینجیل و نە ئەوانەش بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی "کارل مارکس" نووسیویەتی و نە ئەوانەش دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ "الكافي" و بۆ "الكُليبي" و هاوشێوەی ئەمانە، بۆچی؟ چونکە هیچ دینێك نیە لەژێر گومەزی پەرلەمان.

کەوایە پێشەوا بەم ڕێگایە ناکۆکی و جیاوازی ناهێڵێت کاتێك ڕاوێژ دەکات بە براکانی، یان بە بوونی دەقێك یان دەگەڕێنەوە بۆ دەقێك، یان بۆچوونی زۆرینە پەسەند دەکات یان بۆچوونی کەمینە پەسەند دەکات یان بۆچوونی خۆی پەسەند دەکات، ئەمە لە ئیسلام.

بەڵام لە ئەنجومەنەکانی دیموکراسی بڕیارەکان بەگوێرەی زۆرینە پەسەند دەکرێن، وە پێی دەڵێن "پەنجا کۆ یەك" (٥٠+١) ئەگەر ژمارەی ئەندامەکان سەد بێت، وە سەلیم جبوری بابەتەکە بخاتە دەنگدانەوە: پەنجا دەستیان بەرز بکەنەوە بە بەڵێ و پەنجاکەی تریش بڵێن نەخێر، بابەتەکە یەکلا نەبووەوە، دوای ئەوە ئێزیدیێك دەستی بەرزکردەوە، بڕیارەکە ئیتر بوو بە زۆرینە بە دەنگی ئێزیدی، لێرەدا چی دەڵێن "بڕیارەکە درا بە زۆرینە"، بۆچی؟ چونکە پەنجا و یەك وتیان: بەڵێ، وە چل و نۆ وتیان: نەخێر،

(١)"ڕەش" [بە زمانی کوردی] .

هەرچەندە ئەم هاوسەنگییە بە دەنگی ئێزیدییێك گۆڕا ! کەوایە شورای ئیسلام لە کوێی دیموکراسییە لە پەرلەمان؟! ئەمەش بە هەمان شێوە جیاوازییێکە لە نێوان شورا و دیموکراسی.

جیاوازییێکی تر لە نێوان شورا لە ئیسلام لەگەڵ دیموکراسی: لە ئیسلامدا کاتێك پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژ دەکات بە براکانی لە بابەتێك لە بابەتەکان، یان خەڵکی شارێك یان کۆمەڵێك -بابەتەکە هەر چۆنێك بێت- بەدڵنیاییەوە تیایاندایە هاوڕا دەبێت و تیایاندایە جیاواز دەبێت، جا کاتێك پێشەوای ئیمانداران بۆچوونێکی هەڵبژارد ئەوا کەسی هاوڕا و موخالف ملکەچ دەبن بۆ هەڵبژاردنەکەی پێشەوا، جیاوازی نیە لە نێوان ئەوەی هاوڕا دەبێت و ئەوەی هاوڕا نابێت، هەموویان ملکەچ دەبن بۆ ئەوەی کە پێشەوای ئیمانداران هەڵیبژاردووە ئەمەش لە شورا لە دینەکەمان، بەڵگەی ئەمەش کاتێك پێغەمبەر (ﷺ)ویستی دەربچێت بۆ ئوحود، بەشێك لە صەحابە وایان دەبینی بمێننەوە لەناو مەدینە و بەشەکەی تریش دەیانەویست دەربچن، بەڵام کاتێك بۆچوونی پێغەمبەر (ﷺ)جێگیربوو لەسەر دەرچوون، هاوڕا و موخالف هەموویان دەرچوون هیچ یەکێك لە مەدینە نەمایەوە لەوانەی پێیان باشبوو بجەنگن لەناو مەدینە.

ئەی کێ گەڕایەوە؟ مونافیقەکان، تەنها مونافیق پابەند نابێت بە فەرمانی پێشەوا دوای ڕاوێژکردن، بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله عز وجل ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٦٦ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ﴾[1]، واتە: ئەوەش کە تووشتان بوو لە ڕۆژی بەیەك گەیشتنی دوو کۆمەڵەکە (لە جەنگی ئوحود)دا ئەوە بە فەرمان و ویستی الله بوو، تا ئیمانی باوەڕداران دەربخات * وە دووڕوویی و نالەباریی دووڕووەکانیش دەربخات، کاتێك پێیان وترا: وەرن بجەنگن لە پێناو الله دا، یان بەرگری لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان بکەن، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە جەنگ بەرپا دەبێت ئەوە شوێنتان دەکەوتین و دەجەنگاین، ئەوانە ئەو ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان. بۆیە ئەگەر پێشەوای ئیمانداران ڕاوێژی کرد ئینجا جیاواز و ناکۆك بوون پاشان بۆچوونێکی هەڵبژارد، ئەوا هەموویان گوێڕایەڵ دەبن بۆ فەرمانی پێشەوا و هیچ کەسێك دەرناچێت لە گوێڕایەڵی کردن لە دینەکەمان تەنها مونافیق نەبێت، وە باسی بەڵگەکەشم بۆ کردیت لەبارەی ئەمە، باشە.

لە دیموکراسیدا چۆن بابەتەکە یەکلایی دەبێتەوە؟ هەمیشە حیزبی ئۆپۆزسیۆن تا کۆتایی ڕێڕەوەکە هەر بە دژبوون و بەرهەڵست دەمێنێتەوە، هەروەك دەزانن کۆمارییەکان بوون بڕیاری هاتنە نێو عێراقیان دا،

(١) آل عمران: ١٦٦-١٦٧.

ديموكراسييەكان بەم كارە ڕازی نەبوون، بۆ ماوەی هەشت ساڵە ئەوان بۆيان وەستاون لە ڕێگاكەدا هەر كەموكوڕی و جێگەيەكی تانەدانيان دۆزيبێتەوە ئەوا بەهۆيەوە لە كۆمارييەكان دەدەن و بڵاوی دەكەنەوە لە ڕاگەياندن، بۆچی؟ چونكە بۆچوونيان ئەوەيە نامانەوێت بجەنگين لە عێراق، وە بۆ ماوەی هەشت ساڵە ملكەچ نابن بۆ شوانی چێڵی گەوج لە بڕيارێك لە بڕيارەكانی، بەڵكو هەميشە بۆی لە بۆسەدان، بۆچی؟ چونكە هاوڕا نين لەگەڵی لەسەر جەنگكردن لە عێراق، ئەمە ديموكراسييە، لە ديموكراسيدا ئەگەر دژی شتێك وەستايەوە و هاوڕا نەبوويت لەسەر ئەم شتە ئەوا تا كۆتايی وێستگەكە دەمێنيتەوە و هەوڵدەدەی ئەم كارە پەكبخەيت، وە هەوڵدەدەی بيانو و هۆكار بدۆزيتەوە بۆ ئەوەی ئەم كار و فەرمانە هەڵبوەشێنيتەوە، يان خاوەن بڕيارەكە ناچار بكەی پاشگەز بێتەوە لە بڕيارەكەی، ئەمە لە ديموكراسی بەڵام لە دينی ئيسلام -لە شورا- هەموويان دەردەچن بەبێ ئەوەی هيچ يەكێكيان بمێننەوە، دوو بابەت ماوەتەوە بە ويستی الله تعالى لە ڕۆژێكی تر تەواوی دەكەين، والحمد لله رب العالمين وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، جزاكم الله خيرا.

وەرگێڕان و ئامادەکردنی
پێگەی ڕاستەڕێ

